# خوێندنی قورئان لە تەنیشت گۆڕ

نوسینی :

إمام أبو بكر أحمد بن محمد الخلال

وەرگێڕانی :

طارق حسن الكردي

١٨ محرم ١٤٤٢هـ

٦ ـى أيلول ٢٠٢٠م

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره , ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا, من يهده الله فلا مضل له , ومن يضلل فلا هادي له , وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشرك له , وأشهد أن محمدا عبده ورسوله , صلى الله عليه وعلى آله وصحبه وسلم.

أما بعد:

**ئەمەی لەبەردەستتدایە بریتیە لە کتابی** ( القراءة عند القبور) ي **ئیمام أبوبكر أحمد بن محمد بن هارون بن يزيد البغدادى, الخلال**.

**کەباس لە خوێندنی قورئان دەکات لای گۆڕدا( قەبر )**

**لە م بابەتەدا کۆمەڵێك ریوایە تمان هەیە کە هەندێکیان صحیحن وە هەندێکیان حسنن وە هەندێکیان لاوازن هەندێکیشیان ناڕاستن, کە دواتر دێینە سەری و ڕونی دە کەینەوە .**

**وە لەم بابەتەشدا ئیمامی شافعی و أحمد و کۆمەڵێك لە زانایان فەتوایان لەسەر داوە , ئەوەی کە پێویستە بوترێت لەم بابەتەدا ئەوەیە کە بوترێت لانی کەم بابەتێکی خلافیە وەك هەموو بابەتە فیقهیە خلافیەکانی تر, ئەگەری وەرگرتن و ڕەت کردنەوەی هەیە , نەك بوترێت بدعەیە و بەهیچ جۆرێك دروست نیە وەك ئەوەی ألبانی و ابن تیمیە وادەڵێن, تەنانەت ابن تیمیە ئینکاری ئەوە دەکات کە لە ئیمامی أحمد و شافعی نصێك هەبێت بەدروستیان زانیبێت, کە دواتر دێینە سەر وتەکەی ئیمامی شافعی کە وای نابینێت کێشەی هەبێت.**

**برێك له معاصرين لەم بابەته هەڵهاتون لەترسی ئەوەی قبوریەكان و ئەوانەی عیبادەت بۆ گۆر دەكەن ئەمانه نەكەنه بەڵگه بۆ كاره كوفریەكانیان , ئەمه لەكاتێكدایه ئەم باسه هیچ بەڵگەیەكی تێدانیه بۆ ئەوان و عیبادەت كردن بۆجگه له الله و شركی ئەوان.**

**بۆ سەنەدی حەدیسەكان و تعلیقات سودم له مستخریجەكەی شێخ مروان بن علی الحاجو وەرگرتوه, لەگەڵ ئەو سەرنج و تێبینیانەی نوسیویەتی بۆ ڕۆشن كردنەوەی بابەتەكه.**

**تەواوی سیلسیلەی رجالی كتابەكەم نەهێناوه لەبەر ئەوەی له كتابەكه خۆی مەوجوده دەتوانرێت ئاسان بەدەست بهێنرێت.**

## ناساندنی نوسه‌ر

**أبو بکر أحمد ی کوڕی محمدی کوڕی هارونی کوڕی یزیدی به‌غدادیه , مه‌شهوره به خلال.**

**له‌دایك بونی: له‌سالی ٢٣٤ھ له‌دایك بوه,**

**داواکردن و گه‌ڕانی بۆ زانست: بۆفێربونی علم چوه‌ته فارس, شام , جزیره, بۆداواکردنی فقه و فه‌تواو وه‌ڵامه‌کانی ئیمامی أحمد له بابه‌ته جیاوازه‌کاندا , له‌زۆرێك له زانایانه‌وه نوسیویه‌تی.**

**مامۆستاکانی: حسنی کوڕی** عرفة, **سعدانی کوڕی نصر, یحی ی کوڕی أبی** طالب, **حربی کوڕی ئیسماعیلی کرمانی, یعقوبی کوڕیی سوفیانی فسه‌وی, عباسی کوڕی محمدی دوری, ئیمام أبی داود السجستانی, أحمدی کوڕی منصوری رمادی, عبدالله ی کوڕی ئیمام أحمد, وه زۆری دیکه.**

**قوتابیه‌کانی: ئیمام أبو بکر عبدالعزیزی کوڕی جعفر ناسراو به غلام الخلال خاوه‌نی کتابی زاد المسافر, أبو حسن محمدی کوڕی** مظفر, **وه کۆمه‌ڵێکی دیکه.**

**ده‌رباره‌ی وتراوه:**

خطيب البغدادي : **یه‌کێکه له‌وانه‌ی هه‌وڵو ماندوبونی خسته گه‌ڕ بۆ کۆ کردنه‌وه‌ی زانسته‌کانی ئیمامی أحمد, ماندو بوو , کۆچی کرد له پێناو به ده‌ست هێنانیدا , هیچ که‌س وه‌ك ئه‌و زانسته‌کانی کۆنه‌کردۆته‌وه.**

**أبو بكرى كوڕى شه‌هريار : هيچ كه‌س پيێشى نه‌كه‌وتوه بۆ كۆ كردنه‌وه‌ى زانسته‌كانى أحمدى كوڕى حنبل.**

الذهبي: الحافظ و **فه‌قيه و زۆر زانايه.**

**نوسراوه‌كانى: الجامع فى الفقه _ العلل_** الأمر بالمعروف و النهي عن المنكر_ السنة **كه يه‌كێكه له گه‌وهه‌ره به‌نرخه‌كانى ئه م ئيمامه به‌ڕێزه_ وه جگه له‌مانه‌ش.**

**عه‌قيده‌ى: بريتيه له عه‌قيده‌ى ئه‌هلى سونه و جه‌ماعه و به‌ڵكو ئيمام له‌وپێيازه‌دا, كه كتابى** السنة **باشترين ده‌ليله بۆ ئه‌وه.**

**نيسبه‌تى كتابه‌كه بۆ ئيمام : الحمدلله هيچ گومان له وه نيه كه ئه‌م كتابه هى ئيمامى خلاله له‌به‌ر دوو هۆكار**

**يه‌كه‌م : دروستى سه‌نه‌دى كتابه‌كه بۆ نوسه‌ر**

**دووه‌م: هاو شێوه‌بونى سه‌نه‌دى كتابه‌كه له‌گه‌ڵ سه‌نه‌ده‌كانى كتابى** السنة.

## دەقی کتابەکە

**هەواڵی پێداین ئیمام شرف الدين باوکی عبدالرحمن ( عیسی ) کە وتی : هەواڵی پێداین ئیمام ( محي الدين ) باوکی محمد ( عبدالقادری ) کوڕی أبی صالح , وتی : هەواڵی پێداین باوکی حسین موبارك کوڕی عبدالجبار صیرفی وتی : هەواڵی پێداین باوکی اسحاقی بەرمەکی وتی : هەواڵی پێداین أبوبکر ( عبدالعزیزی ) کوڕی جعفری فەقیە وتی : هەواڵی پێداین**

**أبو بکر ( أحمدی کوڕی محمدی الخلال ) ئەویش فەرموی :**

١ : **عبدالرحمن ی کوڕی عەلائی کوڕی لەجلاج لەباوکیەوە فەرمووی : ئەگەر مردم لە جێی خۆم لەناو گۆڕ دامنێ و بڵێ:** بسم الله وعلى سنة رسول الله **و گڵم بکەن بەسەردا وە لەلای سەرمەوە سورەتی** فاتحة **وە سەرەتای** البقرة **و کۆتاییەکەشی بخوێنە , من گوێم لە عبدالله ی کوڕی عومەر بوو وای دەفەرموو.**[1]

**دووری دەفەرموێت: پرسیارم کرد لە ئیمامی أحمد : شتێکت لەبەرە لەسەر خوێندنی قورئان لەسەر قەبر؟ فەرموی: نەخێر, پرسیاریشم کرد لە یەحیای کوڕی مەعین : ئەم حەدیسەی بۆ گێڕامەوە.**[2]

---

[1] **سەنەدەکەی لاوازە**

[2] **ئیمامی أبو داود هێناویەتی لە مسائل** 1062**, ابن القيم لە روح ص**33.

**چەند ریوایەتێکی جیاواز لەم بارەوە لە ئیمامی ئەحمەدەوە هاتوە, بەڵام وتەی کۆتای ڕێگەی پێداوە لەدوای ئەوەی کە بە بیدعەی داناوە**

**وتەی یەکەمی کە فەرمویەتی بدعەیە : =**

**٢ . ابن عومەر دەفەرموێت بیستم لە رسول الله وە صلى الله عليه وسلم دەی فەرموو :**

**ئەگەر یەكێك لە ئێوە مرد, دامەنیشن و پلەبكەن لە بردنی بۆ گۆڕە كەی, وە لەلای سەریدا سەرەتای** البقرة **بخوێنن وە لەلای قاچیدا كۆتایی سورەتی** البقرة **بخوێنن**[٣] .

---

**ابن هانئ لە مسائل هێناویەتی بەژمارە** 946**دەفەرموێت پرسیارم كرد لە ئیمامی أحمد بۆخوێندنی قورئان لای قەبر فەرموی بدعەیە.**

**وە ئیمامی عبدالله لە مسائلیدا بەژمارە** 544**دەفەرموێت پرسیارم كرد لە باوكم دەربارەی كەسێك قورئانێكی پێیەو دەی هەوێت لەسەر گۆڕێك قورئان بخوێنێت؟ فەرموی ئەوە بیدعەیە, وتم ئەگەر لەبەری بێت؟ فەرموی: نەخێر؟ تەنها سەلامی لێدەكات و دوعای بۆدەكات .**

**وتەی دووەمی كە ڕێگەی داوە : ئیمامی عبدالله لە مسائیلدا هێناویەتی بەژمارە** 543 **گوێم لێبوو پرسیاریان كرد لە باوكم دەربارەی پیاوێك قورئان دەخوێنێت لای قەبر لەسەر مردوو؟ باوكم وتی: وای دەبینم كێشەی تیانەبێت.**

**مەروەزی دەفەرموێت: گوێم لە ئەحمەدی كوڕی حەنبەل بوو فەرموی: ئەگەر چونە گۆڕستان**آیة الكرسي **و سێجار قل هو الله أحد بخوێنن لە سەری** ( طبقات الحنابلة 224/2) والمغني( 422/2) والفروع ( 308/2) والروح ص190.

ابن قدامة **لە مغنیدا** ( 422/2 ) **دەڵێت ئیمامی أحمد لەو قەولەی گەڕاوەتەوە كەدەفەرموێت قورئان خوێندن لای قەبردا بیدعەیە.**

[3]**سەنەدەكەی زەعیفە, یحیی كوڕی عبدالله ی بابلتی و أیوبی كوڕی نهیكی تێدایە كە هەردوكیان زەعیفن, أبو حاتم دەفەرموێت أیوب زەعیفە لە** حدیث **أبو زرعەش دەفەرموێت لێوەی مەگێڕنەوە ( منكر** الحديث)**ه.**

٣. علی کوڕیی موسی حداد دەڵێت کە کەسێکی ڕاستگۆیە : لەگەڵ ئیمامی أحمد و محمدی کوڕیی قدامە ی جەوهەری بوم لەسەر جەنازەیەك کاتێك خستیانە گۆڕو دا پۆشرا پیاوێکی نابینا لای سەری دانیشت و دەستی کرد بە قورئان خوێندن, ئیمامی أحمد فەرموی: ئەی پیاو خوێندنی قورئان لای گۆڕ بیدعەیە, کاتێك دەرچوین لەگۆڕستان محمدی کوڕی قدامە وتی بە ئیمامی أحمد: ئەی باوکی عبداللە چی دەڵێیت دەربارەی مبشر الحلبی؟ فەرموی متمانە پێکراوە, محمد پێی وت هیچت لێوە نوسیوە؟ فەرمووی : بەڵێ, محمدی کوڕی قدامە وتی: هەواڵی پێدام مبشر لە عبدالرحمانی کوڕی علائی کوڕی لجلاج لەباوکیەوە کە وەسیەتی کردوە ئەگەر مرد لای سەریەوە سەرەتای البقرة بخوێنن, ئیمامی أحمد کە ئەمەی بیست فەرمووی: بگەرێوە و بەو پیاوە بڵێ با قورئان بخوێنێت.[4]

٤. هەواڵی پێداین أبوبکری کوڕی صدقە کە وتی: گوێم لێبو لە عوسمانی کوڕی أحمدی کوڕی ابراهیمی موصلی کە وتی: ئەوەی پێشووی گێڕایەوە.[5]

٥. سەلەمەی کوڕی شبیب دەڵێ: چومە لای ئیمامی أحمد پێم وت: من عفانم بینی لای قەبرێك قورئانی دەخوێند لە مصحفدا , ئیمامی أحمد پێمی وت: خەتمی بۆ کراوە بە خێر ان شاء اللە.[6]

---

[4]سەنەدەکەی حەسەنە, تاريخ بغداد 145/19, ذيل تاريخ بغداد 222/4_223, ابن القيم في الروح ص13.

[5]سەنەدەکەی حەسەنە, شمس الدين المنبجی لە کتابی تسلية المصائب ص174دەڵێت: ئەوەی ڕون و ئاشکرایە لای ئیمامی أحمد خوێندنی قورئان لە گۆڕستان و سەر قەبر کێشەی نیە,وە ڕای أبوبکر عبدالعزیز و قاضي و کۆمەڵێك لە هاوەڵانمانە, ئیمامی أحمد پێی بیدعەبوو دواتر لە بۆچونی گەڕایەوە و پێی دروستە.

[6]سەنەدەکەی حەسەنە. لەسەنەدەکەی عباسی کوڕی محمد و جعفری کوڕی حسینی نیسابوری هەیە کە هەردوکیان شێخی ئیمامن , وە سەلەمەی کوڕی شبیبیش متمانە پێکراوە ( الجرح و التعديل 164/4 ).

**٦ . حەسەنی کوڕی هیثم دەڵێت: أحمدی کوڕی حنبلم بینی, نوێژیەکرد لە پشتی پیاوێکی نابینا کە لەسەر قەبر قورئانیەخوێند[٧].**

**٧ . هەواڵی پێدام روحی کوڕی فەرەج وتی: گوێم لێبوو لە حەسەنی کوڕی الصباح الزعفرانی کەوتی: پرسیارم کرد لە ئیمامی شافعی دەربارەی خوێندنی قورئان لای قەبر, فەرمووی: هیچ کێشەی تێدا نیە[٨].**

---

[7]**سەنەدەکی سەحیحە , ابن قدامە لە المغنی** 519/3 .
ابن أبي شيبهة **لە مصنف بە ژمارە** 10852 **دەی گێرِێتەوە لە جابری کوڕی زەیدەوە کە : لای مردودا سورەتی رەعدی خوێندوە.**

[8]**سەنەدەکەی صەحیحە , روحی کوڕی فەرەج متمانە پێکراوە وە , بە جێی سیقەی داناوە لەحەدیسدا** خطیب **لە تاریخەکەیدا( 4460 ) وە حەسەنی کوڕی صباح کە أبو علی البغدادیە و صاحبی شافعیە و بەمتمانەیان داناوە زیاد لە زانایەك لە حدیسدا ( الجرح و التعدیل** 36/3 ) و تهذيب الكمال 310/6.
**وە لە کتابی أم هاتوە 322/1 و لە معریفە للبیهقی 7746 کە ئیمامی شافعی فەرمویەتی : پێم خۆشە ئەگەر قورئان بخوێندرێت لەسەر گۆڕ و دوعا بۆ مردوو بکرێت.**
**کەوابوو لای شافعی دروستە قورئان بخوێندرێت لەسەر قەبر, وە ئەوەی ابن تیمیە کەدەیلێت شافعی وای نەوتوە و ألبانیش شوێن قسەکەی ئە و کەوتوە ڕاست نیە و بەهەڵدا چون.**
**وە لای مەزهەبی مالکیش قولی جیاواز هەیە.**

٨. **ئیمامی شەعبی دەفەرموێت: أنصار واتە پشتیوانانی مەدینە ئەگەر کەسێکیان لێ مردبا قورئانیان لای گۆڕەکەی دە خوێند**[9].

٩. **منصور لە إبراهیم وە دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: کێشەنیە لە خوێندنی قورئان لە گۆڕستاندا**[10].

١٠. **بۆی گێڕامەوە باوکی یحی ی ناقد کە وتی: گوێم لێبوو لە حەسەنی کوڕی حور دەی وت: ڕۆشتم بەلای قەبری خوشکێکمدا سورەتی تبارکم خوێند, پیاوێك هات بۆلام وتی: لەخەونمدا خوشکەکەتم دیوە دەیوت : الله پاداشتی باوکی علی بداتەوە , سودم وەرگرت بەوەی خوێندی**[11].

١١. **حەسەنی کوڕی** هیثم **بۆی گێڕامەوە وتی:** خطاب **هات بۆلام وە دەستی بەسترابوو دەیوت: ئەگەر هاتیتە گۆڕستان قل هو الله أحد بخوێنە, بۆئەهلی گۆڕستان دەبێتە پاداشت**[12].

---

[9] **سەنەدەکەی کێشەی نیە ان شاء الله** , ابن أبي شيبة **لە مصنف هێناویەتی بە ژمارە** 10848, **وە لالەکائی لە** السنة **بەژمارە** 2176, **هەندێك قسە هەیە لەسەر مەتنەکەی بەلأم کاری پێدەکرێت ان شاء الله** .

[10] **سەنەدەکەی حەسەنە , هەروەها خلال لە کتابی** الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر **ص**89 **گێڕاویەتیەوە**.

[11] **سەنەدەکەی صحیحە , خلال لە کتابی** الأمر بالمعروف **هێناویەتی ص**90, **وە ابن القیم لە روح هێناویەتی ص**11.

[12] **سەنەدەکەی صەحیحە , خلال لە** الأمر بالمعروف **هێناویەتی ص**90, **وە ابن القیم لە روح ص**11.

١٢. هه‌واڵی پێدام حه‌سه‌نی كوڕی هیثم كه وتی: گوێم له أبوبكری كوڕی أطروش كچه زای أبی نصری تمار ده‌ی وت: پیاوێك ده‌هاته لای گۆڕی دایكی ڕۆژی جومعان سوره‌تی یس ی ده‌خوێند, ڕۆژێك وه‌ك جاران هات سوره‌تی یس ی خوێند پاشان وتی: یا الله ئه‌گه‌ر تۆ سوێندد خواردوه كه بۆ ئه‌م سوره‌ته پاداشت هه‌بێت , ئه‌وا پاداشته‌كه‌ی بڕژێنه به‌سه‌ر ئه‌م گۆڕستانه‌دا , له جومعه‌ی داهاتوو ژنێك هات بۆلای و وتی : تۆ فلأنی كوڕی فلأنه ئافره‌تی؟ وتم به‌ڵێ, وتی: من كچێكم هه‌یه له‌م گۆڕستانه مردوه , له‌خه‌ونمدا دیم له‌سه‌ر لێواری گۆڕه‌كه‌ی دانیشتوه , پێم وت: بۆچی لێره دانیشتویت؟ وتی : فلأنی كوڕیی فلأنه ئافره‌ت هات بۆلای گۆڕی دایكی, سوره‌تی یس ی خوێند, بوو به پاداشت بۆ ئه‌هلی ئه‌م گۆڕستانه, ئێمه‌ش له‌و به‌ره‌كه‌تیمان به‌ركه‌وت یان الله لێمان خۆشبوو.[١٣]

---

[13] سه‌نه‌ده‌كه‌ی صه‌حیحه , خلال له الأمر بالمعروف هێناویه‌تی ص90, ابن القیم له روح هێناویه‌تی ص13.